## بەشی دووەم

## وانەی دووەم

# بۆچی ئێمە فێری زانستی داراییبین؟

لەساڵی ١٩٩١ مایکی هاوڕێم شوێنەکی باوکی گرتەوە، واتا چوە شوێنی باوکی کارەکانی ئەم بەڕێوەی دەرد زۆر لەباوکی باشتر. ئێمە دووجار یەکترمانبینی لە پارگایەکی گۆڵف. ئەو خۆی و خێزانەکیە بەشیوەبە دەوڵەمەندبوون زۆر لەوەزیاتر کە وێنایدەکەیت. پێشتر باوکی سەروەت و سامانێکی زۆر پێکەوەنابوو لەو ناوچەیەدا و ئێمەی بەباشی پێگەیاندبوو.

لەساڵی ١٩٩٤ من خانەنشینبووم لە تەمەنی ٤٧ ساڵیدا و خێزانەکەم کیم لەتەمەنی ٣٧ ساڵیدا، بەلاَم خانەنشینبوون واتا نەکردنی کار ناگەیەنێت. بەڵکو لەوکاتانەدا شتێکی زۆر چاوەڕوان نەکراو ڕویدا کە بریتی بوو لە زیادبوونی سامانەکەمان بەرێژەیەکی زۆر و ئەتۆماتیکی. ئێمە ئەمانتوانی کاربکەین و کارنەکەین بەلاَم سەرمایەکەمان زۆر زیادیکرد. بەلای منەوە ئەمە وەك ئازادیەوابوو بۆ مان. ئەسیتەکەمان زۆر زیادکرد بە هەوڵدانی خۆمان، هەروەك چاندنی دارێك و ئاودانی بۆ ماوەی چەند ساڵك و پاشان کە گەورەبوو پێیوستی بەئاووونابێت. ڕەگەکانی تەواو چوبوونە قولاَیوە

سێیەردارەكە لەبنیا دەحەسباینەوە. مایك بڕیاریدا كە سەروەت و سامانەكەی باوكی بەڕێوەبەرێت و من خانەنشینبوو.

كاتێ من وتاردەدەم بۆ خەڵكی ئەوان پرسیارم لێدەكەن ئامۆژگاری تۆ بۆم چیە؟ پێیوستدەكات ئێمە چیبكەین؟ چۆن ئەوان دەستپێبكەن؟ من ئەم كتێبەم بۆ پێشنیاركردن. ئەوان چیكارێك بكەن بۆ ئەوەی منداڵەكانیان بەباشی ئامادەبكەن و پێبگەیەنن؟ نهێنی سەركەتن چیە؟ من چۆن بوومە ملیۆنەر من هەمیشە ئەم ئارتیكڵە دەهێنایەوە بیری خۆم.

بازرگانی دەوڵەمەندترین

لە ئوتێلێكی كە ناردەریا لە شیكاگۆ لەساڵی ١٩٢٣ كۆبوونەوەیەكی بازرگانی و سەركردەكان بەڕێوەچوو. لەنێوان ئەو بازگانانەدا كەسایەتی چاراس سشواب لێوو كە بەڕێوبەری گەورەترین كۆمپانیابوو لەبواری سەربەخۆی ستیدا واتا مادەی ستیل. و سامیۆڵ ئنسوڵ كە بەڕێوبەری بەشی گاس و كارەبا، هاوارد هۆپسۆن بەڕێوەبەری گەورەترین كۆمپانیای گاسبوو، ئیڤار گروجێر كەبەڕێوبەری باریە نێودەوڵتیەكان، لیۆن فرازی كەبەڕێوبەری بانكی نێودەوڵەتیبی، ریچارد ویتنی كەلە ولایەیت نیۆرك بەڕێوبەری كڕین فرۆشتنی شتوومەك، ئەرز كۆتن و جێس لیفمۆر كە دووگەورەترین جامبازی شتوومەكبوون. ئەلبێرت فۆڵ كە ئەندامی ئەنجومەنی وەزیرانبوو. پاش ٢٥ ساڵ ٩ كەسە لەوانە كۆتایان بەكارەكەیان هێنا یان بەهۆی مردنەوە بێت یان خانەنشینبوونەوەبێت. سچویا مرد بەبێ ئەوەی پارە لە دوای خۆی جێبێلێت و ئنسوڵ و

گروجێر و کۆتۆن مردن ویتنی و ئەلبێرت زندانی کران و فراسە و لیفەرمۆر خۆیاکوشت.

من زۆر نیگەرانم ئەگەر یەکێ بپرسێ ئەو پیاوانە چیا بەسەر هاتووە. ئەگەر سەیری تەئریخی ساڵی ۱۹۲۳ بکەیت بۆ ۱۹۲۹ ئەوا بازرگانی بەتەواوەتی لە دارماندابوو و مارکێتەکان بازاڕیان زۆرکەمی کردبوو. ئەم رووداوە کارگەری گەورەی هەبووە لە سەر ئەم پیاوانە. پۆینتەکەمان لێرەیە، ئێمە ئێستا لە سەردەمێدا دەژین کە زۆر خێراتر و گەشەکردوتره لە لەسەر دەمی ئەم پاوانەی کەباسمانکرد. لە ۲۵ ساڵی داهاتوودا من گومانده‌بەم ڕێژەی بازرگانی و وەبەرهێنان زۆر زیادبکات بە بەراورد بەو سەردەمی پێشوو. بەلام من زۆر لەوە نیگەرانم کە خەڵکی زیاتر جەخت دەکەنەوە سەر پارە نەك فێربوونی زانستی پارە و فراوانکردنی بیرکرنەوەیان. ئەوان دەوڵەمەندەبن و وادەزانن پارە هەمووکێشەکەیان بۆ چارەسەردەکا. بەڕاستی من زۆر لەم بیرکرنەوییە دەترسم. چونکە ئەگەر پارەی زۆریش بەدەستبێن، بەلام زانیاریت لەسەر بواری ئابوری نەبێت ئەوا هەر خێرا لەدەستیدەدەن.

زۆربەی خەلکی لەم ڕاستیە تێناگەن لە ژیانیان. ئەو گرنگنیە کە تۆ تاچەند پارە کۆدەکەیتەوە ئەوە گرنگە کە تۆ چۆن پارێزگاری لێدەکەیت. هەروەك ئەو چیرۆکانەی ڕۆژانە دەیبیستین کەکەسێك خێرا دەوڵەمەند دەبێت و هەر خێر موفلیسدەبێت، لەملێنێریەوە دەچنەوە قۆناغی سەرەتا.

چەندەها نموونەی ترمان لایە وەك یاریزانەکان کە لەماوەیەکی کەمابوونەتە ملیۆنەر بەلام وەك یاریزانێ کە لە تەمەنی ۲٤ ساڵیدا

توانیبێتــە ملیۆنــەر بــەڵێم ٣٤ ســاڵی لــەژێرپردا دەخــەوت و ســەیارەی دەشۆدر و داوای پارەی لە هاوڕێکانیدەکرد ئەمانە بۆچی ڕوودەدەن ئەگەر ئێمە زانیارێکی باشمان هــەبێت دەربارەی لایــەنی ئـابوری ئــەم ڕوداوان کەمدەبنەوە. لە ساڵی ١٩٩٧ دەبینین زۆرێلە خــەڵی بوونەتــە ملیۆنێر من بەمە دڵخۆشم بــەڵام ئەوگرنگە کــە چۆن ئەوپارەیە بپارێزێت. هــەر لەو پارەیە پارەی کەبەرهەمبێنیت.

خــەڵکی زۆر لــێم دەپرســن مــن لەکــەوێوە دەستپێیکەم، یـان چۆن خێرادەوڵەمەندبم؟ بەڵام زۆربــەیان بەوەڵامەکــەم نیگەراندەبن چونکە من باوکی دەوڵەمەندم ئەوەی فێرکدووم کە لەپێشا فێـری زانستی ئـابوریبم. ئەمە ئەو بیروبۆچونەیە کە لەباوکی دەوڵەمەندم بۆم ماوەتەوە و هەمیشە پیــادەی دەکــەم. هــەروەك پێشــتر وتوومــە بــاوکی دەوڵەمەندەکــەم ئامۆژگاری دەکرد کە کتێب زۆر بخوێنمەوە.

ئەگــەر تــۆ بتــەوێت بینایــەك دروستبکەیت دەبێـت لەپێشا بناغەکەی بنیادبنێیـت و بناغەکــەی دەبێـت نزیــەی ١٢ بــۆ ١٣ ســانتیم کۆنکرێتبێت ئەگــەر ئــەم کــارە نەکــەی ئــەوا خانەوەکــەت ئەگــەر ڕوخـانی هەیــە بــە هەرکاتێکـدابێت. سیســتەمی قوتابخانــەکان دروســتبووە لــە ســەردەمی ســەردەم کشـتوکاڵیەوە ئــەم سیستەمە ئــەوەکانما پێدەگەیــەنێت بــەبێ بناغەیــەکی پتــەو دەربــارەی بــواری دارای و ئـابوری. بــەڵام مــن و مایك بناغەیەکی ئابوورمان هەبوو چونکە باوی هەر لەمنداڵیــەوە فێـری کـردی و بنیادینایین.

دەکرێــت ئێســتا بــواری ژمێریــاری ناخۆشــترین بابــەتبێت لەجهانــدا. لەوانەیــە ئەمــە بوبێتــە شــتێك سەرلێشــوێنەر. بــەڵام ئەگــەر تۆبتــەوێت

دەوڵەمەندبیت، دەبێت ئەم بابەتە ببێتە گرنگترین بابەت لەلات. پرسیارەکە لێرەدایە ئایا تۆ چۆن دەتوانیت ژمێریاری کەئەو وەسفانەی بۆی کراوە لێ جیابکەیتەوە و فێری منداڵەکانتی بکەیت؟ وەڵامەکەی زۆر سادەیە بەم وێنەی دەتوانیت فێریانبکەیت. باوکە دەوڵەمەندەکەم من و مایك فێری ئەمبابەتەکردوە هەر لەمنداڵیەوە و بناغەیەکی پتەومان هەیە. ئەو چەند رێگەیەکی سادەی هەبوو بۆ فێکردنمان. بۆ چەند ساڵێك من وێنامدەکێشا و چەند وشەیەکمان بەکاردەهێنا. من و مایك بەسادەی تێگەیشتبووین دەربارەی وێنەێشاتەکە، جوڵەی پارە. دوای چەند ساڵێك باوکە دەوڵەمەندەکەم ژمارەی بەکاردەهێنا. بۆ مایك ئەم شێواز ئاڵۆزتربوو چونکە ئەو ملیۆنان دۆلاری لەژێردەستابوو و شکرنەوە جیاکردنەوەی کارێکی گرانبوو. بەلام بۆمن ئاسانبوو چونکە وەك ئەو پارەی نەدم نەبوو. بەلام ئێمە تائێستا هەر لەسەر ئەو نەخشە و پیلانە دەرۆین کە باوکی بۆ کێشاوین و منیش هەر ئەوەتان بۆدەکێشم. چونکە ئەم وێنەیە یارمەتی ئێمەیدا کە لە ئابوریەکی کەمەوە بگەینەئەم ئاستە.

یاسای یەکەم: تۆ پێیوستدەکات جیاوازی نێوان وشەی asset و liability. ئەگەر تۆبتەوێت دەوڵەمەندبیت دەبێت ەم یاسایە بزانیت. لەوانیە کەمێك وشکبێت. بەلام زۆبەی خەڵك نازانن گارگەری ئەم یاسایە. زۆبەی خەڵك لەکێشەیەکی گەورەی ئابووریدان چونە نازانن جیاوازی نێوان ئەم دوو وشەیە ئەسێت و لایەبڵیتیت.

زۆرێك لەخلکی پییوستیان بە ئەسێتە. بەلام چینی ناوەند لایەبڵیتی بەکاردێنن وادەزانن ئەسێتە. کاتێ باوکی ئەم بابەتەی بۆ شیکردینەوە واماندەزانی گاڵتەدەکات. بەلام کاتێك بوونەی هەرزەکار بۆمان دەرکەوت

کە ئەمە نهێنیی دەوڵەمەندبوونە. ئەمە خاڵێکە دەبێت بووەستین و بۆ ماوەیـــەکی درێـــژ بـــیری لێبکەینـــەوە. لەوکاتـــەدا مایـــك لـــە باوکەدەوڵەمەندەکەی پرسی مەبەست چیە لە ئەسێت؟ لەوەڵامدا گوتی " پێیوستە زۆربیری لێکەنەوە ئەگەر هەریەئاسانی بیزان ئەوا کارگەریەکی ئەو تۆی نابێت. هەر لەبەر ئەمە ئەم بیرۆکەیە کەمێ ناڕونە و گران لێتێدەگەیت.

من گوتم " تۆ مەبەست ئەوەیە کە ئێمە پێیوستە ئەسێت فێربین و وەربگرین و پاشان دەوڵەمەندەبین.

باوکی سەری لەقاندوو گوتی "ئەوەسادەیە" ئەی باشە ئەگەر سادەیە بۆچی خەڵکی زۆریەنەی دەوڵەمەند نابێت. بەپێکەنینەوە گوتی " چونکە ئەوان نازانن جیاوازی نێوان ئەسێت و لایەبڵێتیتی.

من بیرمە لێمپرسی چۆن گەنجەکان ئاوا ڕفتاریان تائێستا هەرنەزانن. ئەگەر ئەمەسادەیە و گرنگە بۆچی ئەوان هەوڵی ئەوەنادەن فێربین؟ ئەم پرسیارەمان وای لە باوکی کرد کە شیکردنەوەبات دەربارەی هەردوو چەمکی ئەسێت و لایەبڵێتیت.

سەبارەت بەگەنجەکان ئەم زۆر گرانە شیبکرێتەوە. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی گەنجەکان لەم دۆخەدا زیرەکن، واتا ئەم بیرۆکەسادەیە بۆ ئەوان گرندەبێت چونکە ئەوان فێری چەند شتێکی جیاوازبوون لە قوتابخانە بۆ نموونە بانکەوا و ژمێریار ئەم پسپۆڕیانە فێربوون بۆیەش ئاسان نابێت کە جارێکی تر ئەوان بینەوە بەمندالْ و ئەو بیرۆکەیان فێربکەن.

باوکەدەوڵەمەندکەم بڕوای بە ڕێسای KISS هەیە واتا لێگەڕێ باهەر بەسادەی بمێنێتەوە. هەروەك چۆن ئەو ئێمەی فێری ئەم زانستە

ئابوریـەکردوە بۆتــە بناغەیــەکی بنچـینەی بۆمـان. باشــە هۆکــاری سەرلێتێکچـون چـیە، چـۆن شـتێکی سـادە دەبێتـە ششـتێکی گـران و ناڕەحـەت؟ چـۆن خـەڵکی بڕوایـان بـە ئەسێت نیـە و ڕاسـتی لایـەبڵێتی؟ وەڵامەکەی دەدرێتەوە بە زانـیین فێربـوون زانسـتی ئـابوری و بازرگـانی. لێرەدا جەخدەکەینەوە لەسەر وشـەی خوێنـەوەر نـەك خوێنـەوار لـەبواری ئابوری. پێناسەی ئەسێت و لایەبڵێتی هیچیان پێناسـەناکرێن بـە وشـەی. ئەگـەر تـۆ بـە فەرهـەنگ بتوەوێـت مەبەستەکەی تێبگـەیت ئـەوا سـەرت لێتێکدەچێت. لەوانـەی ژمێریارەکـان شـتێکی لێبـزانن بـەلاَم بـە زۆرینەیـە خەلکی شتێك هەستپێنەکراوە.

کاتێك کەئێمـە منـداڵبووین باوکەدەوڵەمەندەکـە پێیـدەگوتین" پێناسـەی ئەسێت بە وشەناکرێت، بەلاَم بەژمارەدەکرێت. ئەگـەر تـۆ نـەتوانی ژمـارە بخوێنیتــوە ئــەوا تــۆ نــاتونی لــە ئەســێت تێبگــەیت. لــە ژمێریاریـــدا باوکەدەوڵەمەندکەم " وتی ئەمە ژمارە نیە بـەلاَم ژمـارە چیت پێدەڵێت. وەك وشە وایە بەلاَم وشەنیە. بەلاَم چیرۆکێکەی وشەیەکە کـە پێتـدەڵێت. زۆربـەی خـەڵك کـە ئەمـە دەخوینێتـەو لێـی تێناگـەن، ئەمـەپێی دەڵـێن خوێندنەوەی لێتگەشتنانە. ئێمە توانای جاوازمان هەیە بـۆ تێگەیشـتن لـە وشـتانەی کەدەیخوێنینــەوە. بـۆ نموونــە. ئەگــەر مــن موبایــل بکــڕم و کتێبێکی لەگەڵدابێت واتا کەتـەلۆك دەربـارەی پرۆگرامـەکانی و چـۆنیەتی ڕێکـۆرکردنی بەرنامـەکان. ئەوشـێتانەیە ئەگـەر مـن بچـم کەتەلۆکەکـەی بخوێنمـەوە. چـونکە هـیچ شـتێك ئەونـەی پرۆگرامـی موبایـل گرانیـە. مـن ئەتوانم وشەکان بخوێنمەو بەلاَم لێیتێی تێناگەم. مـن ئـەنجامێکم دەست

دەكەوێت. ئەمەش هەمان شتە دەربارەی ڕوونكرنەوەی ئابوری بۆ زۆربەی خەڵكی.

ئەگەر تۆ ئەتەوێت دەوڵەمەندبیت ئەوادەبێت بتوانی لە ژمارەكان تبێبگەیت. من لە باوكەدەوڵەمەندەكەمەوە بیستوومە كە دەوڵەمەندەكان ئەسێت وەردەگرن و هەژارەكان لایەبلیتی. لێرەدا ئێمە جیاوازی نێوان ئەسێت و لایەبلیتی دەردەخەین، هەرچەندێكە كە زۆرێك لە پسپۆڕانی ئابوری و ژمێریاری پێنارازین. بەلام ئەم وێنەیە بناغەیەكی باشبوو بۆ ئێمە دەربارەی زانستی ئابوری. بۆ ئەوەی ئەم دوو مندالە تێبگەیەنێت باوكی دەوڵەمەندم نموونەی سادەی زۆر دەهاوردەوە، دوور لە ئالۆزی.

ئەمە كاشفلەوەیەكە بۆ شێوازی ئەسێت




ئەم خشتانەی سەرەوەی داهاتە واتا ئەو داهاتەی بەدەستیدێنێت لە چەند هەفتە و مانگ و ساڵی داهاتوودا. لەگەڵ ڕێژەی داهات و تێچوو. واتا ئەو

پارەی بەدەستی دێنین و ئەوەی سەرفدەبێت. خشتەكەی خوارەوەش پێیدەگوترێت تەرازووی گشتی واتا تۆچەندێكت هەیە و چەندێك قەرزاری، واتا لەكاتی خۆیایەیت. بۆیە وای پێدەگوترێت چونكە دەكرێت ئەسێت و لایەبڵێتی دژییەكبن. زۆریك لەئابوری ناسان نازانن جیاوازی نێوان ئنكەم ستەیتمێت و بالانس شیت بكەن. بۆیە لەسەرەتای كتێبەكە باسی جیاوازیەكەیمانكردوە. یەكێك لەكێشە ئابووریەكان بریتیە لەوەی خەڵك نازانن مەبەستی و مەئنای ئەم دووچەمكە ( ئەسێت و لایەبڵێتیت) ئەمەش هۆكارە بۆ بەهەڵدابردنی زۆرێك لەخلكی چونكە ئەوان مەبەستی وشكەكە لە




ئەرمەنگ وەردەگرن. ئەگەر ڕاهێنان بكەی بە ژمێریارێك بێگومان ئاساترەلە باقی خەڵكی، بۆیە ئەگەر ئەم وشیە لە فەهەنگ دەربێن

تێگەیشتنی قورسدەبێت. هەروەکو پێشتر گوتم " باوکی دەوڵەمەندم فێریکردووین، کە ئەسێت (asset ) واتا ئەو پارەی کەدێتە باخەڵتەوە واتا بەسودە.

ئەمەش شێوازی کاش فلەوەیە بۆ لایەبڵیتی.
لەم وێنەیەدە پێناسەی هەردوو چەمکی ئەسێت و لایەبڵیتیم بۆ کردوون، کە ئاسانترە لە پێناسەی وشەی فەرهەنگی. ئەسێت واتا دەستکەوتنی پارە و هاتنەگیرفانت، بەلاّم لایەبڵیتی واتا دەرهاوردنی پارە لەگیرفانمان. ئەگەر تۆ بتەوێت دەوڵەمەندبیت ئەمە زۆرگرنگە کەتۆفێریبیت.
ئەگەر تۆ ئەتەوێت هەژاربیت ئەوا هەموو ژیانت یا لەسەر لایەبڵیتیبێت یان ئەگەر ویست و دەوڵەمەندبیت یا هەمووژیانت لەسەر ئەسێتبێت.
توانی نووسین و خوێندنەوە لە هەردوو ژمارە و وشەدا بنچینەی هەوڵدانی ئابوورییە. ئەگەر خەڵکانێك کێشەی ئابووریان هەبێت یان ئەوەتا خوێندنەوەی ژمارەکان و وشکان نازانن یان لێیان تێناگەن. دەوڵەمەند بۆ دەوڵەمەندە چونکە، ئەوان خوێنەوارتر و رۆشنبیرترن لەخەڵکانی ترت.
لەبەر ئەوە ئەگەر تۆ ویستو دەوڵەمەندبین دەبیت زۆر باش خۆت فێری خوێنەوارییکەیت و توانای تێگەیشتنت زۆر باشبێت. ئەم تیرەیەی خوارە نیشانەی بۆ کاشفلەوە. ژمارەکان بەتنیا زۆر بچووکن هەروەها وشەکانی. بەلاّم ئەمە چیرۆکی کۆکردنەویە. لە راپۆرتی ئابووریدا خوێندنەوەی ژمارەکان واتا گەران بەدوای پلۆتی چیرۆکەکە. چیرۆکەکەمان ئەوەیە کە کەی لەکوێ کاش فلەوەرودەدات. چیرۆکی ئابوری بریتیە لەوچیرۆکەی کە لە ٨٠٪ خێزانەکان کاردەکەن بۆ ئەوەی بەرەوپێشبچن، بەلاّم ئەوان

ناتوانن چونکە ئەوان لەژیانیاندا لایـەبلیتی پەیرەوەدەکـەن لەبـەری ئەسێت. بۆنموونە لەم کاشفلەوەیەدا باسی خەلکی هەژاردەکات کە سـوڕی ژیانیـان چۆنە.

کار




ئەم وێنەی خوارەوە کاشفلەوەی چینێن ناوەندە.

ئەمە وێنەی کاشفلەوەی ئەو خێزانانەیە کە خاوەنی سەرمایەی زۆرن.






هەموو هێلکارێکان بە شێوازێکی سادە ڕونکراوەتەوە، هەموو کەسێك تێچوون ڕودەدات لەژیانیدا. وەك خواردن و جل و شوێنی حەوانەوە. ئەم هێلکاریە پشاننماندەدات کە چۆن کاشفلەوە بەرێوەدەچێت لە ژیانی کەس هەژار و چینی ناوەند و دەوڵەمەند. ئەم کاش فلەوە چیمان پێدەڵێت؟ ئەم هێلکاریە باس لەوە دەکات کە چۆن پارەکەیان بەرێوەبەرن. پاشان چی بکەن کاتێك کە ئەوان پارەیان بەدەست هاورد.

هەر لەبەر ئەم هۆکارەش نموونەی پیاوێکی دەوڵەمەندی ئەمەریکمان هاوردەوە، چونکە پێموابێت ئەمە کێشەی زۆرێك لە خەڵکیە. کەبریتیە لەوەی خەڵکی وادەزانێت پارە هەموو شتەکان چارەسەردەکات. هەر لەبەر ئەوەش زۆرنیگەرانـدەبم کاتێك کەێك پێمدەڵێت دەمەوێت دەوڵەمەندیم زۆربەخێرای یان لەکوێوە دەستپێبکەن؟ یان دەڵێن من

بوومەتـە ژێربـاری قـەرزێکی زۆرەوە پێیوسـتم بەپارەیـەکی زۆررە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەم.
لەڕاسـتیدا، پـارەی زۆر چارەسـەری کێشـەکەناکات. بـەڵکو لەوانەیـە کێشەکە زیاتر زیاترکات، پارە هۆکارێکی سەرەکی بۆ زیادکردنی کێشە و گرفتەکانی مرۆڤ. پارە زۆربەی جار نیشانە دەخاتە سەر ئەو شوێنەی کە ئێمە نـایزانین. ئەمـە بۆچـی؟ زۆربەیکاتـەکان کاتێـك کەسێك پارەیەکی زۆری دەیدەکـەوێت بەماوەیـەکی کـەم ئـەهۆی چـەند شـتێکەوە وەك ( مانەوەی سەروەت و ساما لە باوانەوە، بۆجەی زۆر، بردنـنـەوەی یانسیب) بەلاّم هەرزوو ئەو برەپارەیە لەدەستدەدەن دەگەڕێنـەوە دۆخـی جـاران. لـەوە ناخۆشـترنیە کاتێـك برپارەیـەکی زۆرت پێبێـت و لـەناکاودا لەدەستیبدەیت. پـارە تـەنها وەك شتێکی ئاشـکراوایە کـە بـە شـێوازی کاشفلەوە لەمێشکدا دێت و دەچێت. ئەگەر شێوازەکە وابێت تـۆ هەرچیت دەستکەوت خەرجیدەکەیت ئەوا وەکە ئەوە وایە کـە ڕێـژەی سـەرفکردنی پارە ڕوو لە زیادبوونە. هەروەکو وتـراوە هەرچـی زوویەدەسـتی بێتی زوو لەدەستت ئەچێت. من لەمنداڵیەوە پێمگوتراوە برۆ بۆ قوتابخانـەو فێری شـتێکبەو پسپۆڕیەبەدەستبێنە. ئەمانـە گـرنگن ئەگـەر ئێمـە لـە فێـربین دەربارەی پارە شانەبەشانی قوتابخان. کـاتێ کـەم لەقوتابخانـەبووم لـە ساڵی ١٩٦٠ کە تەلەبەیەك زیـرەك بوایـە نـاودەردەکرد و خـەڵکی ڕێزێکـی زۆریان لێدەگرت پیندەگەت تۆ دەبیتە دکتۆر. ئەمـە تـەنها لەبـەر ئـەوەی دکتۆر پـارەی بـاش وەردەگرێـت. بـەلاّم ئـەمرۆ دکتـۆر ڕووبـەڕوی کێشـەی ئـابوری بۆتـەوە بەشـێوازێك کـە من هـەرگیز ئـاواتی پێنـاخوازم. چـونکە

هــەمووی لەلایــەن كۆمپانیاكــان و خاوەنكارەكــان و حوكمەتـــەوە كۆنترۆڵكراوە.

كاتێكە منداڵكانمان دەچن بۆ یاری گۆڵف و تایگروود و كۆمپیتەر نێد و موڤی ستار و ڕۆكستار و بیوتی كوین و یان كڕین و فرۆشتن لەسەر شەقامەكان بۆچی دەچن تەنها لەبەر ئەوەی شوێنێكە بۆ تاوبانگ و بەدەستهێنانی پارە. ئەمەش هۆكارێكی سەركی هاندانی منداڵەكانمانە لە قوتابخانە. لەگەڵ ئەمەشدا كەئەوا دەزانن ئەم پشیە بەدەستی دەهێنن زۆر سەركەوتنیە لەگەڵ ئەكادیمی سەركەتن. لەبەر ئەوەی قوتابی قوتابخانە تەواو دەكات بەڵام هیچ پسپۆڕیەكی نیە دەربارەی پارە و ئابوری.

زۆربەی دەچوانی قوتابخانە لە پیشەكەیاندا زۆر سەركەوتوون بەڵام دواتر ڕوبەڕووی كۆمەڵێ گرفتی ئابوری دەبنەوە. ئەوانكاری گراندەكەن بەڵام سەركەوتوونابن. ئایا ئەوان بۆچی نازانن پارەبەرهەمبێنن ؟ یان بۆچی نازانن پارەكانیان سەرفكەن؟. یان پاشتەوەی پارەكەیان بەدەستهاورد چیكارێك ئەنجامبدەن؟ ئەمە پێیدەگوترێ زانستی بواری ئابوری كەكاتێك پارەت بەدەستهاورد چۆن مامەڵەی لەگەڵدەكەیت، چۆن پارەكەت دەپارێزی لەوەی كە خەڵكی لێتنەبا بەهەر شێوەیەكبێت؟ چۆن پارە بەباشی كار بۆ ئێمە بكات؟ زۆربەی خەڵكی ناتوانن پێمانبڵێن دەربارەی كێشە ئابووریەكانیان چونكە ئەوان تێەگەیشتوون لە كاشفلەوە. ئەگەر كەسێ خوێندنی تواوكردبێت و خاوەنی پیشەیەكی باشبێت و زانیاری لەبواری ئابووریداهەبێت ئەوا كاردەكات بەگرانی بۆ بەدەستهێنتی پارە نەك بۆ ئەوەی پارە كار بۆ ئەوبكات.

ئەم هێکاریەی خوارەوە شێوازی ئەوکەسانە نیشندەدات کار گراندەکەن. بۆنموونە خێزانێ ژن و پیاوێ هاوسەرگیریانکردوە و خوێندی زانکۆیان تەواوکردوە و ژیانیان پێکەوەیە لەخانویەکی بچوک کرێدا. ئەوان درك بەوەدەکەن کە پێوستە پارە پاشەکەوتکەن چونکە ژیانی تاکی ئاسانتریووە لە جووتی. کێشەکە لە خانەوە بچوکەکەدایە چونکە ئەوان بڕیاردەدەن کە پارە پاشەکەتکەن بۆ کرینی خانویەك بۆ ئەوەی بژین لەگەڵ منداڵەکانیانە بەئاسودەی. ئێستا ئەوان دوو داهاتیان هەیە و دووکاریان هەیە بەمە ڕێژەی داهات زیادەکات.






لەم هێلكاریەدا بڕی تێچوون زیاددەكات

تێچووی بۆ زۆرێك لەخەڵك بریتیە لە باج. زۆرێك لەخەڵكی بەداهاتی باجی دادەنێـن. بـەڵام زرینـەی بـاجی ئەمـەریكا بـۆ ئشـوێنس كۆمەڵایەتیـە. ئەوەكاتێك دەردەكـەوێت كـە بـاجی ئیشورێنسـی كۆمەڵایـەت و مێدیكـەیر یەك بگرن وەرگرتی لە موچـەی فەرمانبـەران واتـا بەرێـژەی ٧. ٥٪ بەڵام بەراستی سەدا پانزەیە. هەروەها بۆ خاوەنكارێش پێیوسـتە پارەكەبدات بە بڕ. واتـا خاوەنكـار كـاتێ پارەكـەدەدات ڕاسـتەوخۆ نایدا بـەتۆ. تـۆ پێیوسـتە بـاجی داهـات بدەبـە بـەپێی ئـەوەی لـە یاسـای ئیشورێنسـەكەداهاتوە. واتـا ئێـوە كـاتێ ئـەو بڕیارەیـەتان لێـدەبرێت

وەریناگرنەوە بەڵكو ئەوە وەك باجی لێبڕاو وایە تایبەتە بە ئیشورێنسی كۆمەڵیەتی.

ئیشورێنسی كۆمەڵیەتی: ئەو موچەیە كە حوكمەت دەیدا بەوكەسانەی كەتوانای كاركرنیانیە. لێرەدا حوكمەت ئەم پارەیە وەك باج لەهاولاتیانی دەبڕێت بەرێژەیەكی كەم.

بەرزبوونەوەی رێژەی لایەبڵیتبت




ئەگەر باس نموونەی پێشوبكەین دوو هاوسەرەكە كاتێك كەهوڵیاندا لەخانەوە تەسكە رزگاریانبێت و بچنەخانووی خۆیان بۆ ئەمكارە بڕیاریاندا پارە كۆكەنەوە. ئەوان ئێستا پارەكەیان كۆكردۆتەوە دەچن

خانویەکی تازە دەکرن. بەڵام لەگەڵ کرینیماڵکە دەبێت بزانن کە دەبێت باجێکی نێیان بۆ زیاد دەبێت، پێی دەڵێن باجی ملکو سامان. واتا دەبێت باجی خانەوەکەبدەنە حوکمەت. پاشان سەیارە و کەلوپەلی تازەی ناومال دەکرن. بەئەنجامدانی ئەمکارە لایەبڵیتی هەڵدەستێ لەخەو بە زیادبوونی قەرزی بانکی و قەرزەکانیتر واتا بۆ کرینی ئەم شتانە پێوستمان بەقرزەهەیە بۆ یە قەرزدەکەن لە بانکەکان. بەئەنجامدانی ئەمکارە ئەوان دەچنەناو یاری ریت رەیسەکە کەپێشترباسمانکرد. پاشان کەمندالیانبوو پرۆسەکە دووبارە و دووبارە دەبێتەوە واتا کاردەکەن بەقورسی و پارەی زیاتریاندەستدەکەوێت لەگەڵ زیادبوونی پارەکەیان رێژەی باجدان زیادەکات ئەمە پێیدەگوترێت براکێت کریك.

کاتێ کە ئەو خێزان بانك دەکرێن بۆ شتێك دەڵێن ئێمە هیچ ناکرین تەنها سەیردەکەین و کاردەکەیان هەڵدەگرن لە کیفەکەیان.

من کاتێ لەو دوو خێزانە دەکۆڵمەوە سەیردەکەم ناویان گۆراوە بەڵام ئابووریەکەیان هەروەك خۆیەتی. پاشان دێن پرسیارم لێدەکەن دەربارەی ئەوەی وتوومە لە کۆرو سیمینارەکاندە دەربارەی زانستی ئابووری. دەڵێن ئێمە چۆن پارەکەمان چاشەکەوتکەین. بەڵام ئەو خووەی رۆانەی کە لەسەر راهاتوون هۆکاری سەرەکیە بۆ کەمبووی داهاتیان. ئەوان نازانن کە چی هەڵبژاردنێکی نا دروستیاندەوە کەهۆکارە بۆ زیادبوونی کێشە وابووریکانیان. ئەمەش لەئەنجامی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوان نازانن جیاوازی بکەن لە نێوان ئەسێت و لایەبڵیتی.

پارە هەرگیز کێشەکان چارەسەرناکات بەڵکو ئەوە زیرەکیە کە کێشەکان چارەسەردەکات ئەمە وتەیەکی هاورێکەم وەبیر دێنێتەوە کە دیگوت پارە

هۆکارێکە بۆ قەرزاربوونی زۆرێك لەخەڵکی. ئەگەر تۆ کەوتیتە ناو چاڵێك پێش هەمووشتێك دەبێت واز لەوەبێنی کە چاڵکە هەڵکەنی. باوکی دەوڵەمەندم هەمیشە ئەم وتە جاپانیەی دەگوت " هێزی شمشێر و هێزی و گەوهەر و ئاوێنە"

شمشێرەکە نیشانەی بۆ هێزی چەك. وەك ئەمەریکا چەندەها ملیۆنە دۆلاری سەرفکرد لە بەرهەمهێنانی چەکدا بۆ یە ئێستا هێزێکی باڵی هەیە لە جیهاندا. گەوهەر نیشانەیەکە بۆ هێزی پارە.

ئاوێنەش نیشانەی بۆ ڕوناکی زانیاری. بەگوێرەی پەندە جاپانیەکە ئەم هێزەلە هەموویان بەنرخترە. خەڵکی هەژار هەمیشە دەیەوێت لە ڕێگەی هێزی پارەوە کێشەکانی چارەسەربکات. بۆیە هەمیشە کاردەکات بەقورسی. ئەوان بیرنامەنەوە کە بەڕێگەیەتر هەوڵبەن ئەمکێشەیان چارەسەربکەن بەڵکو هەر لەسەر ئەوە دەڕۆ کە لەسەری ڕاهاتوون. بەڕاستی ئەوانە لەپارە تێنەگەیشتوون. زۆرینەیە خەڵك دەیانەوێت لەڕێکەی هێزی پارەوە کێشەکان چارەسەریکەن بەلاّم ئەوان ئەو هێزە بەمارجەهێنن لە دژی خۆیان. ئەگەر ئەوان هێزی ئاوێنەکە بەکاربێنن ئەوا دەپرسن لە خۆیان ئایا ئەمە سودی هەیە ئێمە ئەنجامی دەدەین؟ نەك پشت بە ژیری و زیرەکی خۆیان ببەستن. زۆرینەی خەڵکی تەنها ئەوە دەکات کە دەکرێت لەچواردەوری بەبێ بیرکردنەوە.

ئەمە وەك بیرۆکەی هەمەچەشنەی وایە کە بریتیە لە ماڵکەت گەورەترین ئەسێتە و گەورەترین شوێنی بەرهەمهێنانە، باجەکانت کەمبکەرەوە بۆ ئەوەی قەرزە زۆرەکەت، هەوڵبدە کارێکی باشت دەسکەوێت و هەڵەکە و خۆت توشی مەترسیمەکە.

وەکو وتراوە ترسلە قسەکردن لەبەردەم خەڵکیدا زۆر زیاترە لە ترسی مردن. بەگوێرەی توێژنەوەکان هۆکاری ئەم ترسە دەگەڕێتەوە بۆ ترسی ئۆستراسیزم. وەك ترسان لە وەستان لەبەردەم خەڵکیدا وترسان لە ڕەخنەلێگرتن و گاڵتەپێکردن وشڵەژان و جیاوازبوون لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا. هەر لەبەرئەمە باوکی خوێنەوارم دەگوت " وتە جاپانیەکە کەباسی ئاوێنەدەکات زۆر بەهادارترە لە وانی دیکە چونکە لەڕێی ئاوێنەوە ئێمە ڕاستیەکان دەبینی. هۆکارێك سەرەکی بۆ ئەوەی خەڵکی دەڵێن دوور لەکێشە کارەکەت ئەجامبدە بەبێترس. هەرشتێك ویست بەدەستی بێنە وەك پارە و کارکردن.

هەمان ترسی ئۆستراسیزم ڕاستە بۆ ئەوخەڵکەی بەبێ بیرکرنەوە ئەوکارانەدەکات کە خەڵکی ئەنجامیدەدات، واتا ڕای زۆرینە بەلایەوە پەسەندە. زۆرێك لە کێشە ئابووریەکانی ئێستا بریتیە لەوەی کە کەسەکان بیرناکەنەوە بەڵکو دوای ئەوەدەکەون کە خەڵکی تر دەیگرێتەبەر. ئێمە پێویست دەکات سەیری ئاوێنەکە بکەین بۆ ئەوەی ژیریخۆمانمان ببینین و دوورکەوینەوە بەو ترسە.

من و مایك تەمتنمان بووە ١٦ ساڵ، ئێمە لە قوتابخانە چەن کێشەیەکمان تۆشبوو، نەك لەبەر خراپیمان بەڵکو لەبەر ئەوەی دەمانویست ئەو بیرۆکە خراپەی نێو قوتابخانە بگۆڕین. پاش قوتاخانە لە کۆتای هەفتەدا من و مایك کارماندەکرد بۆ باوکەدەوڵەمەندەکەم. پاشا کارکردنمان من و مایك چەندەها کاژێر دادەنیشتین لەسەرە مێزێك کە بازرانەکان و پارێزەرەکان و بانکەوانەکان و وەبەرهێنەکان و بەڕێوەبەرەکان و کارمەندەکان کۆبوونەوەیان لەسەر دەکرد. لەکۆبوونەوەکەدا کەسێکی لێبوو لە تەمنی

١٣ ساڵیدا وازی لەقوابخانە هاوردبوو، ئەم کەسە وەك بەڕێوبەرەوابوو ڕێنیشاندەری خەڵکەکەبوو و یارمەتی لەوکەسانە وەردەگرت کەخوێنەواریان هەیە. . ئەم پیاوە خاوەنی بیری خۆیبوو واتا ئەو کارێکی دەکرد بەبیرکردنەوە نەك هەرچی خەڵکیبیکات ئەمیشبیکات. دەیگوت " من هەیشە نیگەرانم بەدوو ڕستە یەکەم بریتیە لەوەی خەڵکی دەیلێن بۆیە ئەوکارە دەکەم زۆربەی خەڵکی ئەو کارە دەکات و وشەی ناتوانم واتا ئەگەر پرسیارت لێکرد بۆ ئەنجامدانی کارێك مەڵێ من ناتوانم یان ئێو ناتوانین". من و مایك زانیاری زۆر فێربووین لەوکۆبوونەوە بازرگانیەدا زۆر زیاتر لە قوتابخانەفێربیبووین. باوکی مایك ڕاستبوو قوتابخانەی تەواونەکردبوو بەلآم لەبواری ئابوری و داری زۆر زیرەك و سەرکەتووبوو. ئەو دەیگوت" کەسی زیرەکە هەمیشەکەسێك دادەمەزرێنێت کە زۆر لەخۆی زیرەکتربێت. من و مایك سودێکی زۆر مان وەرگرت لە وکۆڕو کۆبوونەوانەدا. لەبەر ئەم هۆکارانە من و مایك لە قوتابخانە دژی بیرۆکەکان دەوستاینەوە کە دژی بیرۆکەکانی خۆمانبێت. واتا مامۆستا هەکاتێ بیگۆتایە هەرچی نمرەی باش نەهێنێت ئەوا داهاتووی ڕوننابێت من و مایك برۆکانمان دەچۆوەیەك. کاتێك گوێمان لەم ئامۆژگاریانە دەبوو تێدەگەیشتین کە قوتابخانە منداڵەکانمان ئامادەناکات بۆ جیهانێکی نوێ و وتەکانی باوکەدەوڵەمەندەکەم بیر دەکەوتەوە دەربارەی قوتابخانە. کە بریتی بوو لەوەی دەیگوت قوتابخانە ناتکات بەخاوەنکار بەڵکو دەتکانە کارمەند. من و مایك پرسیارمان لەمامۆستا دەکرد دەربارەی بۆ چی ئێمە لە قوتابخانە فێری زانستی دارای و ئابوری ناکرێین و چۆنبتوانین خۆمان لەکێشە ئابووریەکان ڕزگارکەین؟ لەوەلآمدا دەیانگوت پارە گرنگنیە

ئەگەر تۆ خوێندنەکەت بەباشی تەواوکەیت ئەوا پارە خۆی بۆتدێت. ئەوەی ئێمە فێربووین دەربارەی هێزی پارە هۆکارەکەی لەدووری مامۆستا و قوابیەکانبووە.

باوکی خوێنەوارم هەرگیز منی هانەدەدا بۆ نمرە هاودن من زۆرجار پرسیارم دەکرد باشە بۆچی؟ بەڵام زۆرجار کە گفتوگۆماندەکرد دەربارەی پارە قسەکاندەکرد. بەتێپەڕبوونی تەمەن من و مایك زانیاریزیاترمان دەزانی دەربارەی پارە و بناغەکەمان زیاتر بەهێزدەبوو. من ئێستاکێنە زانیاریم هەیە دەربارەی کتێبە بەسودەکان و ژمێریاری باج و پارێزەر و ڕێنیشاندەری کارە هەرەوزیەکان و بانکەوان و جامبازی زەیو زار و وەبەرهێنەر. ڕۆژێکیان باوکم پێی گوتم " بۆچیماڵی خۆمان گەورەترین وەبەرهێنانە. بەڵام من دەمگوت وانیە بۆیە ئەو بە هێڵکاریە بۆی ڕونکردمەوە کە دەوڵەمەندەکان بڕوایان وایە کەماڵیان ئەسێتە و هەژارەکان لایەبلێتیە.

باوکی دەوڵەمەند

باوکی هەژارم

| | |
|---|---|
| لایەبڵیتب | ئەسێت |
| خانوماڵ | |

| | |
|---|---|
| لایەبڵیتب | ئەسێت |
| | خانوماڵ |

ئەوەت بەبیردێنمەوە کە پیشتر هێلکاریەمان کێشا دەربارەی ئاراستەی کاشفلەوە دەخست. بەلآم من زیاتر ڕونی دەکەمەکە تێچوون چۆن چۆنە لەگەڵ بوون بە خاوەنی خانو. خانوی گەورە واتا تێچوی گەورە. لێرەدا کاشفلەوە دەچێتە دەرەوە لە ستونی تێچوون.




لێرەدا هەموو ئەو تێچوونانەی کە لەماڵدا ڕوودەدات خستومانەتە ڕوو. هەروەك پێشتر باسمانکرد لایەڵیتی رواتا دەچونی پارە لەگیرفانی تۆ لێرەدا کڕینی خانوی گەورە بریتیە لە لایەبلیتی چونکە دەبێت کۆمەڵی تێچوون بگرتە ئەستۆ. تائێستاش من بەرنگاری ئەو بیرو بۆچونە دەبمەوە کە دەڵێن ماڵ ناتوانرێت بێتە ئەسێت. من زۆرێك لەخەڵکی دەناسم خەونیان ئەوەیە ببنە وەبەرهێنەرێکی گەورە. بوون بەخاوەنی ماڵی خۆت لە هیچ باشترە. واتا واباشترە تۆ خانویەك بکڕی بۆ ئەوەی تێیدا بژی بەڵام کێشەکە لێرەوە دەست پێدەکات هەندێکەس خانویەکی گەورە و زۆر خۆش و گرانبەها دەکڕێت لەمکاتەدا خانوکەت نابێتە ئەسێت.

دەبێتە لایەبڵێت، چونکە ئەمە پارە لە گیرفانت دەردێنێت. من دەمەوێت ئەمە لە چوارخاڵدا شیبکەمەوە هەرچەندە زۆرێك لەخەڵی بەمە نارازی چونکە بابەتی خانو بابەتێکی گرنگە. بۆیە هەرکاتێ ئەم هەستە دروستبوو زانستی داری ئابوری بەرەو چەمنەوە دەچێت. من بەپێی ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتوە کەپارە هۆکارە بۆ بردانی بە هەستو سۆز.

١. کاتێ تۆ کەخان و دەکریت دەبێت پارەیەك بدەی کەپێشتر هەرگیز خاوەنی نەبووی واتا کاتێ تۆ خانویەك دەکری بەقیستی ٣٠ساڵ و هەرمانگەو برێك پارە دەدەیت بۆ پڕکرنەوەی قەرزە درێژخایەنەکەو.

٢. پاشان تێچونێکی کە زیادەبێت، کە برتیە لە باجی سو لەسەرنەو قەرزەی تۆکردووتە لە وبانقە کە خۆی لەخۆیدا کارێکە کەتێچون بەرەو زیادبووندەبات. پاشان ئەم تێچونە لە موچەکەی دەبرێت. هەتا پارەی خانەوەکەی تەواودەبێت.

٣. باجی سەروەت و سامان، خێزانەکەم توشی شۆکبوو کاتێ زانی باجی خانوەکەمان کەیشتۆتە هەزاردۆلار لە مانگێکدا. لەکاتێکدا کە ئێمە خانەنشینبووین. ئەم ڕوداوە ئێمەی زۆر نیگەرنکردی و بڕیاردان بۆ بەجێهێشتنی خانەوەکە.

٤. خانوو هەمووکاتێ نرخی بەرزنیە و بەهادارنیە لە ساڵ ١٩٩٧ هاورێیەکم نزیکەی ملیۆنێك دۆلاری قەرزکردبوو بۆ کرینی خان و بەڵام دوای خانوەکەی فرشتەوە بە ٧٠٠,٠٠٠ دۆلار.

٥. گەورەترین لەدەستدان بریتیە لەوەی دەرفەت وهەلەکان لەدەستبدەیت. ئەگەر تۆ پارەکەت داوە بەخانویەك و پارەی زۆرت

بەدەستەوەنیە. ئەوا تۆپێویستە کاریەباشی بکەیت بۆ ئەوەی پارەی زیاترت دەستکەوێت چونکە تێچونت زیادەکات لەجیاتی ئەوەی ئەسێت زیاد بکات وەك پێشتر ڕونمانکردوە لە هێکارێکەدا. وەك شێوازی چینی ناوەندی کاشفلەوە کە چۆن کاشفلەوە ڕودات لە دهاتەکەیاندا. ئەگەر ئێوە دووسەر خێزان و پارەکەتان وەك ئەسێت بەکاردەهێنن لە سەرەتای دروستبوونی خێزانەکەتان، زۆر ئاساندەبێت کە دوای بەسەر کێشە ئابوریەکاندا زاڵبن. منداڵەکانتان بنێرنە زانکۆ و خەرجی بۆ دابینکەن. ئەو ئەسێتەی بنیادتانداوە یارمەتی دەرە بۆ پڕکرنوەی تێچونەکان.

بڕیاردرا کە ببنەو خاوەن خانوی خۆیان لە لینۆ و خانویەکی گرانبەها، کەئەمە زیانی بۆ سەر تاکەکان دەبێت کەدابەشی دەکەین بۆ سێ خاڵ

١. لەدەستدانی کات چونکە ئەتوانرێت ئەوکاتە بەکاربهێنرێت بۆ گەشەدان بەئەسێتێکی تر

٢. لەدەستدان بڕیپارەیەکی زۆر کە ئەتوانرێت ئەم پارەیە بۆ وەبەرهێنان بەکاربهێرێت.

من ناڵێم خانوی مەکرن بەڵو دەمەوێت تێتانبگەیەنم کە جیاوازی نێوان ئەسێت و لایەڵیتی بکەن. پێش ئەوەی من بمەوێت خانویەك بکرم دەبێت لە ئەسێت تێکەیشتبێتم و پاشان ئامادەکردنی سوری کاشفلەوە بۆ تێچوی بڕیپارەکە. بڕیارە ئابووریەکەی باوکی هەژارم هەمیشە دەخەری ژیانی چەندین کەس بوو کە لەیاری ڕیت ڕیسا گیریانخواردوە. لایەنی تێچوون زیادی کردوە لەگەڵ داهاتەکەی زاتا هەرگیز وەبەرهێنانی

نەكردوە لە ئەسێتەكەی واتا خانویەكی نەكڕیوە بیدابەكرێ یان دووكانێ یان هەشتێكی تر كە پارە بەرهەمدێنێت. لەئەنجامدا لایەبڵێتی زادەكات وەك رەهن و كارتی قەرز و ئەوشتانەی كە پارەت لێدەباتو وەك كڕینی سەیارە و موبایلی گرانبەها و ئەوشتانەی كە پارەی تێدا خەرج دەكەیت زیاترە لە ئەسێت. لەم هێڵكاریەی خوارەوەدا بۆت ڕونكراوەتەوە.

بڕیاری دارای باوكی هەژارم




داری و پارەی باوكی دەوڵەمەند لەم هێكاریەدە دەخەینەڕوو كە چۆن ئەسێت زیاترە لە لایەبڵێت.




ئەمە هێکاریە ئەوە دەردەخات کە بۆچی باوکی دەوڵەمەندم دەوڵەمەندە؟ چونکە ڕێژەی تێچوون و لایەبلێتی کەترە لە داهات بەدایمی ئەمەوادەکات کە داهاتمان کۆێتەوە سەرفنەکرێت. بەزیادبوونی ئەسێت داهاتەکەمان زیاتردەبێت لە پێشتر کە ئەمەسورێك دروستدەکات بەرەو زیادبوونین داهات.

## ئەنجامی باوکی دوڵەمەندم دەوڵەمەندیە




چینی ناوەندی زۆربەی کات ئەم کێشەیان توشدەبێت. واتا کاتێ داهاتەکەیام زیادەکات لە رێگەی موچەکەیانەوە لەگەڵ زیادبوونەکەدا یەهاوبەشی لەگەل باج و تێچوونکەدا واتا تێچوونەکەمان زیادەبێت ئەگەر داهات زیادی کرد ئەمە چۆن دەبێت کاتێ داهات زیادی کرد خواست زیادەکات کە خواست زیادیکرد تیچوون زیادەبێ بەیەکسانی لەگەل ئەو مووچەیەی وەری دەگریت. ئەمە وەک یاری رەیت ریسەکەوایە کە چینێ ناوەندی تێیدەکەون.




بۆچی چینی ناوەندی هەمیشە لە کێشەی ئابوریدان؟

شێوازی مامەڵە لەگەڵکردن لەگەڵ خانوەکەت شێوازی وەبەرهێنانە، بەڵام بەزیادبوونی بووجەکەت ئەو چینە خانوی تازە و خۆشدەکڕن وقەرزارێکی زۆر دێتە سەریان، ئەمە هۆکارێکە بۆ ئەوەی کە بواری ئابووریان دایەم ناجێگریێت و لە کێشەدابێت و ئابووریەکی دڵنیاین نیە. بەشێوازێکی

بنەڕەتی لەوانیە ئەوان موچە وکارەکەیان باشبێت بەلام هۆکاری کێشەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ کەم زانیاریان دەربارەی زانستی ئابوری و دارای.

لە ساڵی ١٩٩٠ بێکاریەکی زۆر ڕویدا کە ئەم بێکاریە کاری کەری ڕاستەخۆی هەبوو لەسەر ئابوری چینی ناوەند. کۆمپانیاکانیش پارە خانەنشینیان نەهێشت بە پیلانی ٤٠١. خانەنشینین بەتەواوەتی لە کێشەدابوو و کە بەشێوازێکبوو کە لەوە پێش شتی وا ڕوینەدابوو بەتایبەتی کاریگەریەکەی لە سەر چینی ناوەندەوە دیاربوو. بەلام ئەمڕۆ خەڵکی ئەو کێشەیان چارەسەرکردوە بەچەند ڕێگایەك یەکێك لەو ڕێگایانە کڕینی پشکبووە لە کۆپانیاکان و زیادبوونی وەبەرهێنان و بەرێژەیەکی زۆرتر لە جاری پێشوو کە ئەمە جموجۆڵی گەورەی خستە بازاڕەوە. ئەمڕۆ بەهۆی درووست بوونی کڕینی پشکەوە مامەڵی چینی ناوەندی لەگەڵ کێشەکانی ئابوری ئاسانترکردوە.

موچوەڵ فاوند بوبووە شتێکی گشتی چونکە سەلامەتبوو، کڕیارانی موچوەڵ فاوند زۆر سەرقاڵبوون بە کارکدن بە دانی باج و ڕەهن و پاشەکەوتکردنی پارە بۆ منداڵەکانیان و دانەوەیە پارەی قەرزەکەیان. ئەوا کاتیا نەبوو بۆ ئەوەی بخوێنن کە چۆن وەبەرهێنان ئەنجامدەدرێت. ئەوان تەنها پشتدەبەستن بە ئەزموونی بەرێوبەری پشکەکانی کۆمپانیا. لەبەر ئەوەی موچوەڵ پێك هاتوە لە چەند شێوە جیاوازی وەبەرهێنان، ئەوان وادەستدەکەن پارەکەیان بێمەترسە لەبەرئەوە ئەوان ئەو پارەی لە چەند جۆرە وەبەرهێناندا دادەنێن واتا پارەکە تەنها بۆ یەك لایەنی وەبەرهێنانینیە. زۆریەی چینەخوێنەوارەکەی چینی ناوەندی بەبێ

بیركردنەوە دەبنە خاوەن پشك لە كۆمپانیاكان چونكە كارێكی سەلامەتە و دوورە لەمەترسی. بەپێچەوانەی لە لایەن بەڕێوبەری ئەم كارانە واتا پیلاندانەری ئابووری و ئەو كەسانەی ئەم كارانە بەڕێوەدەبەن.

تراجیدیا كە بە هۆی نەبوونی زانیاری دەربارەی بواری ئابوریە چونكە ئەم چینە تەنها كارە سەلامەتەكە هەڵدەبژێرێت چونكە دڵنیایە ئەوان نایانەوێت ببنە خاوەنكاری خۆیان هەرلەبەر ئەمە هەر لەو قۆناغەدا دەمێننەوە. لایەبڵیتیان زیاد دەكات بە بێبەنی ئەسێت. تەنها داهاتی ئەوان پشت دەبەستێت بەو موچەیەی وەری دەگرن بۆیە كاری كارمەندی و كرێكاری لای ئەوان زۆر بایەخی هەیە.

ئەمە بەدری ژیانیان بەردەوام دەبێت، ئەوان ئەو دەرفەتانە ناقۆزنەوە كە بۆیان دێتەپێش. كاردەكەن بەباشی و پارەیان دەستدەكەوێت و لە باج و قەرزدا هەمووی سەرفدەكەن واتا ژیانیان وەك بازنەیەك وایە هەردووبارە دەبێتەوە. من وەك لەبەشە كانی تردا گوتومە گرنگترین یاساكان بریتیە لەوەی بتوانین جیاوازی نێوان ئەسێت و لایەبڵیتی بكەیت. ئەگەر ئەمەت زانی تۆ ئەو ڕێگەیە هەڵدەبژێریت كە لە ڕێی ئەسێتەوە داهات زیاد بكەیت واتا تۆ لایەین ئەسێت هەڵدەبژێریت. ئەم ڕێگەیە بەرە دەوڵەمەندبوونت دەبات. بە هەڵبژاردنی ئەم ڕێگەیە و بەردەوامبوونت و زیادبوونی هێڵكاری ئەسێت داهات و زیاد دەكات بەبێئەوەی تێچون لەو زیاتربێت.

بەردەوام بە لە سەر كەمكردنەوەی ڕێژەی لایەبڵیتی و تێچوون. ئەم وەبەرهێنانە بەلای چیتنی ناوەندیەوە وەك وەبەرهێنەرێكی پرمەترسیوایە بەلام ١٠٠٪ بێمەترسیە بۆ نمونە تۆدەتوانیت لە ڕێگەی ٥٠٠٠ دۆلار ١٠٠٠٠٠٠ دۆلار بەدەست بێنی واتا ئەسێت ئەم كارەت بۆدەكات

بەگرتنەبەری رێگاکەی و پارەکەت بۆ بەرهەمدێنێت. وەك پێشتر باسمانكرد ئەسێت ئەو شتانەدگرێتەوە کە پارە دێنێتە باخەڵت واتا تۆ تەکسیە دەکڕی و پارەی پێپەیدا دەکەی یان پاسێ ئەمە ئەسێتە، بەلام لایەبلێتی جیاوازە بۆنموونە تۆ سەیارەیەکی شەخسی ئاخر مۆدێل دەکرێ بە بێئەوەی هیچ پارەیە پەیداکات، تەنها بەس پارە سەرفدەکات. ئەم کێشەیە چۆن ڕوودەدا کاتێ کە خەڵکی زانیاری تەوتویام نیە لەسەر ئابوری و دارای وەبەرهێنان ئەوان بە مەترسی ناوی دەبەن.




کارمەند کاردەکا بۆ ئەم خاڵانە:

زۆربەی خەڵك کاردەکات بۆ موچیەیەك یان بوون بە خاوەن بازرگانی خۆیان دەوڵەمەندبوون. ئەم هەوڵانە کە تۆ نەیدەیت پارمەتی دەرە بۆسەرکەوتنی خاوەن کاروکان و خانەنشینبوونیان.

زۆر کاریکەی بۆ حوکمەت، حوکمەت بەشەکەی خۆی دەبات لە موچەکەت پێش ئەوەی تۆ بیبینیت، واتا هەتا تۆ کار زیاتربکەیت ئەوا پارەی زیاترد دەتدەکەوێت و ڕێژەی باجدانیان زیاتردەبێت کە لەلایەن حوکمەتەوە لێیان وەردەگیرێت.

کاردەکەیت بۆ بانك: پاش باجدان، تێچونی گەورە بریتیە لە ڕەهنی خان و قەرزدانەوەی کرین کرێدیت کارد.

کاتێ تۆ کاردەکەیت پارەکەی تۆ دابەش دەبێت بەسەر ئەم سێلایەنەدا واتا خاوەنکار و حوکمەت و بانك.

ئەگەر تۆ بتەوێت ببیتە خاوەنی کاری خۆت دەبێت. تۆ چۆن ئەم ئامانجە بەدەست دەهێنیت؟ سەرەتا دەبێت زانیاریت زیادکەیت دەربارەی لایەنی ئابوری و بەکارهێنانی ئەو کرێی وەری دەگری لە بواری ئەسێتا. کاتێ ئەسێت لە گەشسەکردندایە چۆن ئەو برە دەبێتە هۆی سەرکەوتنت؟ یان چی کاتێ ئەوان دەزان کە دەوڵەمەندن و سەرکەوتوون و خاوەن سەرمایەن.

لەگەڵ ئەوشدا من تێگەیشتنی خۆم هەیە بۆ ئەسێت و لایەبڵیت و هەروەها بۆ سامان. من ئەم فکرەیەم لە کەسێك وەرگرتوە بە ناوی بۆك مینیستە. هەندێکی کە پێی دەڵێن کواك، هەندێکی کە پێی دەڵێن بایمەت، چەند ساڵ لەمەو پێش ئەو داوای مۆڵەتی کردبوو بۆ کاری وەبەرهێان لە ساڵی ١٩٦١. لە داواکریەکەیدا ئەو باسی ساماندەکات و

دەڵێت. لە سەرەتادا کەمێك ئاڵۆزە بەڵام پاش خوێندنەوەی واتامێنێت. واتا توانای کەسایەتی کە تاچەن توانای هەیە بۆمانەوە، واتا ئەگەر تۆ کارنەکەی ئایا تۆ ئەوتوانی بۆماوەی چەندێك بەردەوامبیت؟ واتا لە ڕوی توانای ئابووریەوە. ئەمە جیاوازی ئەسێت و لایەبلێتمان بۆ دەردەخات. بڕی سامانی کاش فلەوە ئەسێت بەراورد دەکرێت بە هێلکاری تێچوون. با نموونیەك بێنینەوە. من کاشفلەوەم هەیە لە ئەسێتەوە واتا مانگانە ١٠٠٠دۆلارم هەیە بەلاّم تێچونی مانگانەم ٢٠٠٠ هەزدۆلارە. ئایا سامان چیە؟ باسەرەتا بگەڕێینەوە بۆ نمونەکەی پێشو بۆکملیستەر فلولەلرك کە گوتی ئایا چەند ڕۆژێتر تۆ دەتوانیت خۆت ڕاگری بەبێ موچە؟ لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە ئایا ئەگەر تۆ موچەکەت نەمێنێت ئەتوانی بەبێ ئەوە بژیت. ئێمە لە مانگەکەدا ٣٠ ڕۆمان هەی بەگوێرەی پێناسەکەبێت ئەو دەتوانێ هەتا نیوەی مانگەکە خۆی ڕابگرێت. واتا ١٠٠٠ دۆلارەکە بۆ ١٥ ڕۆژ بەلاّم ئەو تێچونی ٢٠٠٠ دۆلارە. بەلاّم کاتێ ئەگەر تۆ ٢٠٠٠ دۆلار بەدەستبێنی لە ڕێی ئەسێتەوە ئەوا تۆ کەسێکی خاوە سمانداری. تۆ ئێستا سامانداری بەلاّم دەوڵەمەندنیم. من تۆ ئێستا کەسێکی کە خاوەنی داهاتی لە ڕێگەی ئەسێتەوە واتا داهاتەکەت بەشی تێچوونەکەت بەزیاوەوەدەکات.

ئەگەر من بمەوێت بڕی تێچوونم بەرزبکەمەوە دەبێت بە هاوبەش لەگەڵ ئەوەدا ئاستی هێلکاری ئەسێتی کاشفلەوەبەرزبکەمەوە. بۆئەوەی سامانەکەم پارێزراوبێت. ئەگەر بەردەوامبکە لەسەر ئەمە من دەتوانم لە ئابوریەکی ناسەربەخۆوە بیمە ئابوریەکی سەربەخۆ. واتا ئەگەر واز لەکارەکەم بێنم دەتوانم تێچوی مانگەکەم دابینبکەم، لەڕێگەی

ئەسێتەوە. یەكێكی تر لە واماتجەكەم بریتیە لە دووبارە بەكارهێنانەوەی ئەوپارەیە لە بوارێكی وەبەرهێنانندا كە بتوانیت قازانجی تیدابكەیت، بەئەنجامدانی ئەم كارە ئەسیتمان زیاتردەبێت. واتا ئەگەر تۆ توانیت سەربەخۆی ئابووریت هەبێت پاشان ئەگەر كارنەكەی هەردەتوانی تێچووندابینكەیت، ئەو پارەی دەستت دەكەوێت ئەوتوانیت سەرفیكەیت لە بوالاێكدا كە ئەسێت بێت واتا پارەت لێی دەستبكەوێت پاشام ئەوتوانی دەوڵەمەندبیت و خەرجیەكەت كەمێتەوە. واتا سەرچاوەی داهاتم زیاتردەبێت بەبەراورد بە كاری پێشوم كە تەنها یەكی سەرچاوەم هەبوو و بەشی خەرجیەكەی بەباشی نەدەكردم. ئەگەر بەردەوام ئەو پارەی بەدەستی دەهینم بیخەمە بواری بازرگانی وەبەرهێنانەوە ئەوا دەتوانم سامانەكەم زۆرتر كەم.

ئەم سێ تێبینیەت بینەچێت.

ددەوڵەمەند ئەسێت بنیاد دەنێت.

- هەژار تەنها تێچوونی هەیە.
- چینی ناوەندی تەنها بە لایەبلێتیت كاردەكەن بەلام وادەزانن ئەسێتە.

ئایا چۆن من ببمە خاوەن بازرگانی خۆم؟ وەلامەكەی چیە؟ گوێلە ئامۆژگاریەكانی دۆناڵد بگرە.

## بەشی چوارەم

## وانەی سێیەم

# بازرگانی خۆت بەرەو پێش بەرە

لە ساڵی ١٩٧٤ ڕەی کرۆس کە ناسرابوو بە دۆزەرەوەی ماک دۆناڵس گوتاری بۆ خوێنکارانی زانۆکۆ تێکسا لە ئوستیندەدات. پاشا لە وتاردان و گفتوگۆکردن لەسەر بواری دەروناسی و پێگەیاندنی گەنجەکان. کیس یەکێ لە هاورێ خۆشەیوستەکانم بوو، لەگەڵ خوێنکارەکان داوامان بە ڕیس کرد ئەگەر کاتی هەبێت دەمانەوێت هەندێك کات بەیەکەو بەرینەسەر. ئەو ڕازیبوو. لە کۆڕەکەدا کە بانگێژکرابوو. پرسیارێکی کرد گوتی "ئایا من ئێستا لە چی بازرگانیەکدام؟ هەمووکان پێکەنین کەئەم پرسیارەی کرد وامانزانی شێتبووە. بەلام دووبارە پرسیارەکەی دووبارەکردوە کەس وەلامی نەدایەوە. بەلام یەکێك ل قوتابیە بوێرەکان گوتی " کێ نازانێت لە جیهاندا کە تۆ کاردەکەی لە ڕیستۆرانت و هەمبەرگر. لەوەلامدا گوتی بەڕێزەکەم من بازرگانی ناکەم بە هەمبەرگرەوە بەڵکو من خاوەنی ملکو سامانی خۆمم.

کیسی هاورێم گوتی" ڕای بەماوەی چەند کاتێ بیرۆکەکەی خۆی شیکردەوە دەربارەی پلانی بازرگانی. بە بیرو بۆچونی ئەم بازرگانی

سەرپشك بریتیە لە فرۆشتنی هەمبەگر بە بازگانیەکی سەربەخۆ. بەلام ئەم لەکاتی بازرگانیدا گرنگترین شت بەلایەوە شوێن و ناوچەی کارە بازرگانیەکەیبوو. ئەو بەڕاستی لە بواری خانوبەرەو موڵك تێگەیشتبوو. دەیگەت ناوچە گرنگترین فاکتەرە بۆ کردنی بازرگانی. بەشێوازێکی بنچینەی ئەگەر کەسێ تێبگات لە بازرگانی سەرپشك کە بریتیە لە دەستکەوتنی قازانج و خێرەکەی و کڕین. ئێمە دەمانەوێت ئەوە رونبکەینەوە کە ڕەی خاوەنی ملکێکی زۆرە لە جیهان و لەتایبەتی لە ئەمەریکا واتا بوونی موڵك لە شوێنی باشدا کاری گەرەی هەیە لە بواری بازرگان. یەکێك لە وانەکان کە کیس هاورێم فێریبووە دەربارەی بازرگان بریتیە لە بوونی موڵکو خانبەرە واتا ئەو ئێستا خاوەنی خەسلی خۆیەتیت. بەڕای ئەو بازرگانی ڕاستەقنە بریتیە لەو مەلکەی کە ئەو تێیدا بازرگای دەکات.

وەك لە بەشی پێشوودا باسمانکرد کە هێلکارێکان و چینین ناوەندی کە تەنها کار بۆ سێ لایەندەکەن وەك سەرەتا بۆ خاوەنکارەکان پاشان دانی باج بە حوکمەت دانەوەی قەرز بە بانکەکان. ئەو وانەی کە رەیس فێری قوتابیەکانی کرد لە زانکۆی تێکسا باوکەدەوڵەمەندەکەم فێری من و مایکی کرد، کە ببن بە خاوەنی کاری خۆت، یەکێك لە کێشەکانی ئابوری بریتیە لەوەی خەڵکی بەدرێژی ژیانیان کاردەکەن بۆ کەسانیتر نەك بۆ خۆیان.

لەم هێکاریەدا زیاتر بیر و بۆ چونکانی ڕیس ڕوندەکەینەوە.




سیستەمی خوێندنی ئێستا گەنجەکانمان ئامادە بۆ ئەوەی ببنە خاوەن پیشەو پسپۆڕی خۆیان بە گەشسەدان بەتواناکانیان. ئەم کارە والە گەنجەکان دەکات کە تەنها پشت بەموچەببەستن و وەك پێشتر باسمانکرد لە هێکاری داهاتدا. پاش ئەوەی قوتابخانەیان بەسەرکەوتووی تەواوکرد دەچنە زانکۆ و لە وپیشەییە کە وەرگیراون زیاتر زانیار و پسپۆڕی پەیدا دەکەن. بۆنموونە ئەوان دەخوێنن بۆ ئەوەی ببنە ( ئەندازیار و دکتۆر و مامۆستای و ژمێریار و کارمەنی و ژێشت لێنەری هتت) ئەم پیشەی ئەمان بەدەستی دەهێنن ویان لێدەکات کە کاریکەن بەڵام بۆچی؟ بۆ بەدەستهێنانی پارە.

ئەم جیاوازیەکی گەرەیە لە نێوان پسپۆڕیت و بازرگانی. کاتێ پرسیار لە خەلکی دەکەی دەربترە ئەوی ئایا بازرگانی تۆچە؟ لە وەڵامدا دەڵێت من بانکەوانم. واتا تۆ خاوەنی بانکەکەی دەڵێت نەخێر من تەنها کاری بۆ دەکەم. لەم نموونەیەدا ئەوان تێکەڵی و ئاڵۆیەکیان دروستکردووە دەربارەبی پسپۆڕی و بازرگانی و خاوەنکاری خۆی.

پسپۆڕییەكەی ئەوان لەوانیە بیانكاتیە بانكەوان بەلام ئەوان پێیستسان بەوەیە كە ببنیە خاوەن كاری خۆیان.

رای كرۆس، بۆ جیاوازی نێوان پسپۆڕی و خاوەنكاری خۆی بۆچوونێك دەخاتە ڕوو دەڵێت" پسپۆڕی من هەمیشە هەمان شتبوە. واتا ئەوكاتەی كەم فرۆشیاربووم میلك شەیكم دەفرۆشت و پشان هەمبەرگر ئەمە پسپۆڕی منە. بەلام بازرگانی ن و بوون بەخاوەن سەرماییە خۆم بریتیە لە ئەرز و خان و ملّ بەشێوازی ئەسێت كە داهاتێكی زۆرم دەستدەكەوێت.

كێشەی قوتابخانە لەوەدایە كە بۆ چی بخوێنی دەبیت بەوە. ئەگەر تۆ بخوێنین بە یاسا ئەوا لە داهاتودا دەبتیە دادوەر. واتا غەڵتەكە ئەوەیە لە هەر بابەتێكدا بخوێنی دەبیت بەوە، بەلام ئێمە بواری بازرگانیمان بوون بەخاوەن كاری خۆتان لەبیركردوە بە قوتابخانە. واتا ئەوان كاردەكەن بۆ چەند كەسێكی تر كە ببنە خاوەن كار و بازرگانی خۆیان. بۆئەوەی بیتە خاوەكاری خۆت و دەوڵەمەندبیت دەبێت دەبێت ئەو بیركردنەوییەو بگۆڕی دەربارەی كاركرد دەبێت خۆت بیربكەیتوە كە بیتە خاوەن كاری خۆت لە جیاتی ئەوەی كار بۆ خەڵكی تر بكەیت. بازرگانیەكەی تۆ دەخولێتەوە بە دەوری ئەسێتەكەدا. بەپێچەوانیە هێلكاری داهات. وەك پێشتر ڕوونمانكردبۆیە لە جیاوازی نێوان ئەسێت و لایەبلّی و تێگەیشتن لە ئەسێت. دەوڵەمەند جەخت دەكاتەوە سەر هێكاری ئەسێت لەكاتێكدا كە كەسانی تر جەخت دەكەنەوە سەر داهاتەكەیان.

بۆیە زۆربەیە کات گوێبیستی ئەوەدەبن کە" دەڵێن ئێمە موچەی زیاترمان دەوێت. " بۆیە من پێیوستە بچمەوە بۆ قوتابخانە و بخوێنم بۆ ئەوەی لە رێگەی بڕوانامەکەمەوە پارەکەم زیادکات. پاشان من کار بە قورسیدەکەم زۆربەی کات بۆ ئەوەی لە کارێکی باش وەرگیرێم، واتا ئەگەر من دەکرام یان کارەکەم بەدڵنەبوو دەگەرێم بۆ کارێکی تر کە موچەکەی زۆرە.

لێرەدا دەمانەوێت بیر بۆچونی رەیس بخیەنەروو، بەڵام ئەگەر تۆ لەم کەسە تێگەیشتبێتی ئەوا تۆ هێشتا بیرکردنەوەی ئەوەت نیە کە بیتە خاوەن بازرگان و کاری. بەڕای ئەم دەبێت تۆ جەخت بکەیتوە سەر هێلکاری داهات کە یارمەتی دەرتە بۆ ئەوەی ئەو ئامرازانەی کە ئەسێت دروستدەکات بیتە خاوەنی.

زۆربەی خەڵکی بۆیە هەژارن چونکە ئەوان وابڕایان بەخۆیان هاوردووە کە ناتوان بەرنگاری مەترسیەکانی ئەمکارە بنەوە واتا ئەگەر ئەوان ببنە خاوەن کاری خۆیان تۆشی زیانێکبن ناتوانن بەرگەبگرن هەر لەبەر ئەم خاڵ ئەوان دەیانەوێت بە سەلامەتی کاربکەن و پارەیان دەسکەوێت وەك وەرگتنی موچیەی مانگانە.

کاتێ قەیرانێکی بێکاری ڕودەدات زۆرێك لە کرێکارەگان ئەشتانەی کە خۆیان ناویاننـاوە ئەسێت تۆشی کێشەیاندەکات، بۆنموونە خانوو سەیارە ، کە ئەمانە مانگانە پێیوستیان بەخەرجیە. یان ئەویاریانەی کە کرییوویانە بە چەندەها ١٠٠٠ دۆلار بەلام ئێستا هیچ بەهایەکی نیە بۆ ئەوان. چونکە ئەوان تەنها پشتیانە بە مووچە و خانەنشینین بەستبوو. کەئەوە نەما ئەوان ناتوان بەرگەبگرن لەو قەیرانەدا.

وای دابنێ زۆرێك لە ئێمە ئەو فۆرمە پڕدەکەینەوە کە بۆ قەرزکردنی پارە لە بانق بۆ کڕینی سەیارە و خانو. ئەمە سودەکەی لە ڕووی نێت وۆرسەوە گرنگە چونکە بەشێکە لە نێت وۆرس. چونکە هەمکاری بانکی و ژمێریاریە کە ڕێگەدەدات بە ئەسێتی کەسەکان.

بەڵام ڕۆژێك دێت قەرزار دەبی و بنچینەی ئابوریت لەرزۆك دەبێت. چونکە ئێمە زۆر شت زیادەکەین وەك گۆلف کلوپ و کتێب و ستیریۆ و تەلەفیزۆن و جلو بەرگ و پێلاو ئەو شتانەی تر کەکاریگەریان هەیە لەسەر زیادبوونی هلکاری ئەسێت. من نیگەران دەبم کاتێك کەسێ دەڵێت کە نێت وۆرس واتا ملیۆنێك دۆلار یان هەرچیەکی بەهادار. چونکە کاتێ تۆ ئەشتانە دەفرۆشی کە ئەسێتە ئەوا ئەو دەستکەوتە دەبێت باجی لێبدەیت. خەڵکی خۆیان خستۆتە قەیرانێك گەورەوە کاتێ کە تەنها کاردەکەن لەسەر دهاتی ماوەکورت واتا ئەوان ئەسێتی خۆیان دەفرۆشن بەبەهایەکی کەم کە لیستکراوە لە بالانس شیتەکەیانە. یان دەستکەوتی ئەم فرۆشتنە باجی لێدەدرێت. لەبەر ئەوە کاتێ کە حوکمەت باجی خۆی دەبات دەبێتە هۆی کەموبنی بڕی پارەیکە ئەدانەوەی قەرزەکە. بۆیە نێت وۆرس زۆر بەهای کەمترە لە وەی بیری لێدەکەیتەوە.

خۆت ببە بە خاوەن کاری خۆت دەستبەکاربە و ئەوشتانەی ئەسێتن بیان کرە و دوور بکەوەرەوە لە وانەی کەئەسێت نین. وەك کڕینی سەیار بە تازە کە هێناتە دەرەوە لە مەئرەز هەرخێرا ٢٥٪ نرخەکەی لەدەست دەدات. ئەمانە ئەسێت نین ئەگەر بانکیش ئەمەت بۆ بکات بە قیست. بۆ گەنجەکانیش پێیوستە کە تێچون کەمبکەنەوە و بنچینەیەکی ئابوری ئەسێت بنیادبنێن. بۆ ئەو گەنجانەی کە لە ماڵی باوکیاندا دەژین

پێیوستە کە فێربرێن دەربارەی جیاوازی ئەسێت و لایەبڵێتی. واتا گەنجەکان با ئەسێتێکی بنچینەیان هەبێت کاتێ هاوسەگیردەکەن و منداڵیان دەبێت و خانوودەکڕن بۆ ئەوەی دووربن لە کێشە ئابوریەکان. چونکە من زۆرێك لەو گەنجانەم بینیوە کە هاوسەرگیریانکردوە تۆشی قەرزاریەکی زۆربوون کە کاتێك زۆریان لەژیانیان تەرخانکردوە بۆ دانەوەی ئەو قەرزانە. کاتێ خێزانەکان ئاخیر منداڵیان ماڵکە بەجێدەهێڵت، ئەوان بەباشی خۆیان ئامادە نەکردە بۆ خانەنشینبوون. توشی بەرپرسیارێکی زۆردەبنەوە. من چەند پێشنیارێکت بۆ دەکەم دەربارەی ئەسێت و جۆرەکانی بۆ منداڵەکانتان. وەك

١. بازرگانی ئەوەناگەیەنێ کە خۆت لەوێ ئامادەبیت واتا ئەگەر تۆ لەشوێنێك کارت کرد ئەوە بازرگانی نیە بەڵکو کارکردنە.
٢. پشك و کەلوپەل
٣. پەیماندان
٤. پشك
٥. بەرهەمهێنانی داهات لە خانووبەرە.
٦. بەڵگەنامەی دانەوەی قەرز
٧. هەرشتیچکی تر کە بەهاداربێت و داهات بەرهەم بێنێت.

باوکەدەوڵەمەندەکەم هەمیشە هانی دەدام بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی ئەسێت دابین بکەم و خۆشم بوێن. واتا ئەگەر تۆ ئەمانەت خۆشنەوێت ناتوایت چاودێریان بکەیت. من هەمیشە خان ئەزەم خۆشویستوە بۆیە هەمیشە هەوڵمداوە کە کۆیان بکەوە و بیانکڕم. پاشان بیان فرۆشم. هەر لەبەر ئەمەشبوو کە کاتێك کێشەیەك دروستدەبوو من ئەو هەستەم

نەدەگۆڕا بەرامبەر خان ئەرزە بۆ یە هەرکەسێك ڕقی لە خان ئەرزە بێت ئەو هەرگیز نایانکرێت. من خۆم حەزم لە کۆمپانیایەکی هاوبەشە لەبەر ئەوەی پێشتر من وەبەرهێنبووم، واتا لەسەرەتاکانی ژیانم من کارم بۆ چـــەندین ڕێخراوکـــردوە وەك( STANDART OIL OF) CALIFORNIA, the U. S marine crops, Xerox corp من کاتێکی زۆر خۆشم لەگەڵ ئەوانا بەسەربردوە، بەلام من پیاوکی کۆمپانیاکانیم من دەمەوێ کاری کۆمپانیابکەم بەلام بەسەر بەخۆی تەك وەك کرێکار کاری تێدابکەم.

بەلای منەوە کڕینی ئەرزەو خانەوەکە وەك کۆمپانیایەکی بچوك وابوو بۆ من. بەلام لەوانەیە من ڕۆژێك بە تەواوی کاری کۆمپانیابکەم بەشێوەیەکی گشتی. خەلکی زۆرێکیان دەترسن لە کێشەکانی ئەرزە خان واتا ئەو کێشانەی کەتوشیاندەبێت. بەلام من حەزم لەم جۆرەکارانەیە بەپێچەوانەی خەلکی کە لەمە دەترسن کە بەمەترسی ناوی دەبەن. بەلام مەترسیەکانی ئەم کارە کارگەری نیە ئەگەر تۆ وەبەرهێنانەکی خۆتت خۆشبووێت و لێیتێبگەیت. لەگەڵ کۆمپانیا بچوکەکا ستراتیجی وەبەرهێنانم من گەشتم کرد بۆ دەرەوەی ئەرزە و خان لەو ساڵەدا. واتا بازرگانی ئەرزە وخانوەکەم لە بچوکەوە دەستی پێکرپاشان وەردە وەردە سامانەکەم زیادی کرد بەلام من باجم کەمی دەدات یان دوام دەخست هەتا بەهاکەی بە شێوازێکی دراماتیکی بەرزدەبێتەوە. واتا من سودی ئەرز و خانەوەکەم لە جاران زیاتر دەپاراست.

بۆ چەند ساڵێك دەبێت کارم دەکرد بۆ کۆمپانیای مارین کرۆپۆکس و خێرۆکس. من ئەو کارەم دەکر کە باوکە دەوڵەمەندەکەم فێریکردبووم.

من لەسەر کارەکەم بەردەوام بووم بەڵام هەر لە مێشکمابوو کە جەبێت خۆم ببمە خاوەن کاری خۆم. هێکاری ئەسێتم زیاتر چالاکدەبوو. من زیاتر بازرگانیم بە خانووبەروە و ئەرزەوە دەکرد بە بەراورد بە چشکی کۆمپانیای کارەکانی تر. بەڵام باوکە دەوڵەمەندکەم هەمیشە جەخی لەسەر زانستی ئابوری دەکردەوە. یەکێك لەو شتانەی بەباشی فێربووم بریتیت بوولە بواری ژمێریار و بەڕێوەبردنی پارەکانمبوو. واباشتربوو کە م بەباشی شکاری وەبەرهێنانبکەم و لەکۆتایدا دەستکەم بە بنیادنانی کۆمپانیاکەی خۆم. من هەرگیز کەسم هانەداوە کەکۆمپانیا دەمەزرێنێت هەتا خۆیان بە تەواوی نەیانویستوە. من دەزانم کە کۆمپانیا چۆن بەڕێوەدەبرێت بۆیە ئاوات ناخوازم ئەم ئەرکە کەسانێکی تر بیگرنە ئەستۆ چونکە گرانە. کۆمپانیا بۆ ئەو کەسانیە کە بەدوای دامەزراندندا دەگەڕێن بەڵام بەدەستی ناهێنن. لەو کاتەدا بۆ ئەوان دامەزراندنی کۆمپانیا دەبێتە چارەسەر. بەڵام لەم چەند ساڵی ڕابردوودا لە ١٠ کۆمپانیا کە دامەزرابوو نۆ یان شکستی هاورد واتا لە ١٠ کۆمپانیان یەکدانەی سەرکەوتوویبوو. من پێشنیارتبردەکم ئەو کارە ئەنجامبدەیت ئەگەر تۆ دامەزراندنی کۆمپانیا تەنها خولیا و ئاواتە.

گرنگ ئەوەیە تۆ بەردەوامبیت لەسەر کار و بیری بوون بەخاوەن کاریخۆت. کاتێك کە من بێت دەڵێم تۆ بەردەوامبە لەسەر بیرۆکەی بوون بەخاوەن بازرکانی خۆت، مەبەستم ئەوەیە کە ئەسێت بنیاتبنێی و هێلکاریەکەی بە بەهێزی بهێڵیتەوە. ئەگەر دۆلاری بچێتە ناوی هەرگیز نایەتەدەرەوە. کەمێك بیر لەمە بکەرەوە ئەگەر تۆ دۆلاری بخیەتە نێو هێکاری ئەسێتەوە، ئەوە وەك فەرمانبەرێك وایە بۆ تۆ کە کارت بۆ بکات،

